ژمارەی بڵاوکراوە: ٦١

ناوی کتێب: **پڕ لە ئەوین بە**

نووسینی: **عمر آل عوضة**

وەرگێڕانی: **زامدار قادری**

دیزاینی ناوەوە: **ئەیاد نادر**

دیزاینی بەرگ: **ئیبراهیم ساڵح**

ساڵی چاپ: **چاپی یەکەم (٢٠٢١)**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

لە بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی ( ٩٦٠ ) ـی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە.

**ئەم کتێبە پێشکەشە بە؛**

* مامۆستا (ئارەزوو)ی خوشکم.

* گشت ئەو لاوانەی خۆشی دونیا سەرقاڵی نەکردوون و، دەرگانەی پەروەرێنی تاقانەیان چۆڵ نەکردووە.

* گشت ئەو مرۆڤە بەخشندانەی تۆزقاڵێک ویژدان لە ناخیان ماوە.

## پێشەکی وەرگێڕ:

سوپاس بۆ پەروەرێنی میهرەبان، درووود و سەلات و سەلام لەسەر حەزرەتی سولتانی دڵان، موحەممەدی ئازیز (سەلامی خودای لەسەر بێت)

وا پەروەردگار دەرفەتی داین لە سێیەم کتێبی نووسەری لاوی سعوودی (عومەری ئالی عۆزە) بە خزمەت دۆستان و ئازیزان شاد بووینەوە.

ئەم کتێبە لە ڕووانگەی خۆمەوە لە جوانترین کتێبەکانی عومەرە، هەڵساوە کۆمەڵێ وشە و ڕازی جوانی لە واقیعی ژیان دەرهێناوە و، بەشێوەیەکی زۆر نایاب دایڕشتۆتەوە.

لەلایەکی دیکەوە ئەم کتێبە ئیدی دەمانگەڕێنێتەوە نێو خەیاڵی پەروەرێن، چونکە زۆربەمان لەدەستمانداوە. خۆ نوێژ و ڕۆژوومان هەیە، بەڵام هێشتا نازانین ئەو پەروەرێنە میهرەبانە چۆنە!

ئیدی بیرمان چووە کە خالقێک هەیە لەسەری سەرەوە، پەروەردگارێکی شیرین، کە بەندەکانی هەرگیز جێناهێڵێت، لەکاتێکدا ئێمە لەوپەڕی بێوەفاییداین بەرانبەر ئەو زاتە.

جگە لەمە لەوە زۆر دڵنیام ئەم کتێبە دەتوانێ ئەو ڕێگا سەختانەی ئێمە هەمانە، کلیلەکەیمان دەست بخات.

وەکو هەموو جار دەڵێم ئەو وەرگێڕانە بریتی نییە لە وەرگێڕانی وشە بە وشە، بەڵکو بە گوێرەی مانایی دام ڕشتۆتەوە و کردوومە بە زمانی شیرینی کوردی.

لەهەر کەموکووڕییەک لێم ببوورن و، ئەگەر توانیتان هەڵەکانم بەخۆم بڵێنەوە و بۆم چاک بکەن، دڵنیا بن هەڵەکان بەو جۆرە چاک دەبنەوە، نەک بچن لای هەموو کەس باسی بکەن و بیلێن هێ لە من نەبێ!

ڕەنگە قەدەر ویسالی گشتمان نەدات کە یەک ببینین، ئەوەندە بەسە دوو دوعای خێرمان بۆ بکەن.

هەمووتانم خۆشدەوێ. ئەوانەش کە خۆشیاننناوێم.

دڵنیا بن پەیامی سـەرەتا و کۆتایی ئێمەیی مرۆڤ ئەوین و خۆشەویستییە.

زامدار قادری

هەولێر - باشووری کوردستان

٢٢ / ١٢ / ٢٠٢٠

## پێشەکی نووسەر:

بسم الله الرحمن الرحيم

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

الحمدلله الواحد القهار، العزيز الغفار، مقدر الأقدار، مكور الليل على النهار، تبصرة لأولي القلوب والأبصار.

سوپاسگوزارییەکی سەروو گشت سوپاسێک بۆ پەروەردگار لەسەر ئەو نیعمەتانەی لەگەڵی کردووین و، داوای زیاتری ئەو فەزڵ و بەخشندانەیی دەکەین.

شاهێدی دەدەم بە حەق هێ لەپەروەردگار کەسی دیکە نییە بۆ پەرستن و، داندەنێم بە حەقییەتی پەروەردگاری ئەو، دوای بینینی ئەو هەموو مەخلوقە.

شاهێدی دەدەم حەزرەتی موحەممەدی نازدار( سەلامی خودای لەسەر بیت) بەندە و خۆشەویست و بەرێزترینی مرۆڤەکانە لە سەرەتا تا کۆتایی بوونەوەران، هیچ کەس وەکو ئەو پەروەردگاری

نەناسیوە و لێی نەترساوە. زانترینە بە پەروەردگار و بەتەقواترینە، لە هەموو خەڵک زیاتر بەندایەتی کردووە و تێکۆشـــاوە بۆی، ملکەچترین و زاهیدترین بوو، گەورەترین مەخلوقی پەروەردگارە. بەخشـندەترین کەسـە بەرانبەر بەندەکانی خودا و، دۆسـتایەتیترین کەسە بۆ بەندەکان.

پاشان:

دڵتان پڕ بکەن لە ئەوین و یەکترتان خۆش بوێت.

تەواو.

عومەر ئال عۆزە

سعوودیە.

هەر کارێکت لەسەر قورس بوو، ڕامەکە بۆ ئەو خەیاڵە نەزۆکانەی لە مێشکی خۆتدا وێنات کردوون. ڕامەکە بۆ گوێگرتن لەو گۆرانییانەی وەسفی حاڵی غەمگینی دەکەن.

بیرت بێت پەروەرێن هەردەم زیندوو و ئاگادارە.



پەروەرێن فەرموویەتی: "دوایی هەموو ناخۆشییەک، خۆشییە."

واتا:

کۆتایی هەموو خەمەکان، شادییە.

کۆتایی هەموو ماندووبوونەکان، حەسانەوەیە.

کۆتایی هەموو هەوڵەکان، سەرفرازی و سەرکەوتنە.

کۆتایی هەموو حەرامکراوەکان، بەخشینە.

کۆتایی هەموو شەرمەزارییەکان، متمانەیە.

کۆتایی هەموو بێهیواییەکان، ئومێدە.

با ڕۆژە سەختەکان زۆر و تاقەت پڕوکێن بن، ڕۆژێک هەر تەواو دەبێت.

سوێند بەوەی دروستی کردووین، تەواو دەبێت.

ئیدی بەرز دەبیتەوە، جا ئەمڕۆ بێت یان بەیانی.

پەنا بە خودا، گەر وا گومان ببەین پەروەرێن بەندەیەک ئازار بدات و دوایی شکاوییەکانی چاک نەکاتەوە!



هەر کەس تەوەکول بە خودا بکات،

نە توشی ناخۆشی دەبێت،

نە بێکەس دەبێت،

نە گومڕا دەبێت،

نە زەلیل دەبێت.



پەروەردگار دوعای مێروولەیەک کە لە کونی
شارەمێروولەکەیەوە داوای ڕۆزی دەکات لە بیری ناکات.

ئیتر چۆن داواکانی تۆ، کە بەردەوام دەیانکەیت لە بیر دەکات!

پەروەردگار ترسەکانی ئەو مێروولەیەی فەرامۆش نەکردووە،

ئیتر چۆن داواکانی تۆ فەرامۆش دەکات!

وا گومان دەبەیت بانگکردنەکانت نابیستێت!

پەنا بە خودا.



له خۆشیشدا بەدەست خۆم نییە هەر دێمە دەرگات،

تا سوپاسگوزاری تەواوی نیعمەتەکانت بم و

ستایشت دەکەم.

ستایش و پێداهەڵگوتنی من چیڕوا نییە، چونکە خۆشم وا نیم!.



بەرانبەرم وەستابوو، بە لاشەیەک کە بیست تریلیۆن خانەی هەڵگرتبوو. هەر خانەیەک پێکدێت لە کۆمەڵێک پرد و دەزگا و ڕێسایەکی ڕێکخراو لەنێو شریتێکی بۆماوەییدا.

بە چاوەکانی سەیری کردم، کە کامێرایەکی ڕەنگاوڕەنگی هەستیار، لەگەڵ کوالێتییەکی یەکجار نایابی تێدا لەخۆ گرتبوو.

لەگەڵ میمۆرییەکی خەیاڵی وا مەزن، کە بۆ هەڵگرتنی وێنە جوڵاو و وەستاوەکان بوو.

بە چەشنێک توانای ئەوەی هەبوو، بە چەند چرکەیەک لە دەماغەوە شتەکان شیبکاتەوە و بیبیانێرێت.

بەرانبەرم وەستابوو بە باڵایەکەوە کە ٦٤٠ ماسولکە کاری لەسەر دەکەن.

زیاد لە بیست ساڵە ئەو دڵەی لێدەدات و شەو و ڕۆژ کار دەکات، ئەگەر نووستوو بێت، یاخود بەئاگا، بێ ئەوەی چاککردنەوەی لە دەرەوە بووێت.

لە کۆتاییدا گەنجەکە هاتە قسەکردن، بە زوبانێک کە ١٧ ماسولکە دەیانجوڵاند،

به‌و ژیرییه‌ مه‌زنییه‌وه‌ پرسیاری كرد:

چ شتێک هه‌یه‌ بیسه‌لمێنێ: "خودا بوونی هه‌یه‌؟"

وه‌ڵامم دایه‌وه‌: "به‌ هه‌بوونی چاوه‌كانت به‌و ڕێكی و ئه‌ندازه‌ جوانه‌."



نەکەی پەنـا ببەیتە بەر کەس تـا نهێنییەکـانی خۆتی لا بـاس بکەیــت، ســــینەی خەڵکی لەوە بچووکترە شـــوێنی بەڵا و کێشەکانی تۆ ببێتەوە

با خودا پەنای هەمیشەییی تۆ بێت.

بانگت دەکات ((فَإِنّي قَرِيبٌ))



خودای گەورە بەتوانایە بەسەر ئەوەی دەنکی خورما لە دارخورما بخاتە خوارە بەبێ هیچ هۆکارێک.

بەلاّم پەروەردگاری گشت هۆکارەکان

لە مریەمی دەوێت هۆکارەکان بگرێتە بەر، بۆ هەســـتپێکردن بە چێژی هیلاکبوونەکەی.

بۆ ئەوەی تۆش هەست بە چێژی هیلاکییەکەت بکەیت،

بۆ تێپەڕاندنی بەربەستەکان لەسـەرتە هەوڵبدەیت و تێبکۆشـی و ڕوبەڕووی ئەو ترسانە بیتەوە کە چواردەوریان داویت.

ئەمانەش تەنیا وەهمێکن.

بزانە کۆتایی ڕێگاکە، چێژ و ئاسودەییە.



هەمیشـــــە لەکاتی ئەنجامدانی هەر کارێکی چاکدا لەناخی خۆتدا ئەمە بڵێرەوە: "هەرگیز چاوەڕێی پاداشت و سوپاسگوزاری هیچ کەس ناکەم."

دڵنیابە پەروەردگار خۆی بە چاکترین شێوە پاداشتت دەداتەوە.



هەر دەبێت ئیماندار تاقی بکرێتەوە و بەڵای بەســـەر بێت، بۆ ئەوەی بگاتە بەهەشــت، بگاتە پلەی دڵخۆشـــییەکی وەها کە هەرگیز دڵتەنگی نەناســێتەوە و بیری نەیەتەوە کەی ناخۆشـــی بەسەر هاتووە!

لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیان پرسی:

"کەی ئاسوودە دەبین؟"

گوتی: "کاتێك یەکەم هەنگاوت دەنێیتە ناو بەهەشــتەوە، ئەوکات ئاسوودە دەبیت."

بۆیە با دڵت ئارامبێتِ، مادام پاشای پاشاکان مژدەی بەهەشتت پێدەدات.



بەسمە تۆ خودامی، بەڕاستی خودایەکی باشیت.

بەسمە تۆم خۆشدەوێت، تۆش باشترین خۆشەویستی.

بەسمە تۆ دکتۆرم بیت، تۆش باشترین دکتۆریت.

بەسمە تۆ جوانترینم بیت، تۆش جوانترینی جوانانیت.

بەسمە تۆ پاڵپشت و پشتیوانم بیت، بەڕاستی باشترینیشیت.



ئەگەر خەڵکی ستایشیان کردیت و ستایشەکەیان ڕاست نەبوو، ئەوا هیچ لە دۆخی تۆ ناگۆڕێت. ئەگەر تانەشیان لێ دایت و تانەکە لە شوێنی خۆی نەبوو، ئەوا هەمدیس هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت.

پەردەی دڵەکان دادراوەتەوە، ناوەوەی هیچ کەسێک دیار و ڕوون نییە، کەس ناخ و دەروونت نابینێت، تەنیا (زاتی پەروەردگار) نەبێت، کە ئاگادار و بینایە. ئینجا خۆدی خۆت.

تۆ باشتر خۆت دەناسیت.

تۆ زیاتر ئاگاداری خۆتیت.

با ستایشت بکەن، تانەت لێ بدەن، تۆ تەنها پێویستیت بەوەی پێویستیت بە هیچ کەسێک نەبێت.



من نوێژ و ڕۆژوو و زیکر و خێرێکی زۆرم ئامادە نەکردووە،

بەڵام دڵم تۆی زۆر خۆشدەوێت.

ئەسڵەن ئەو دڵەی دروستت کردووە بە خۆشەویستی تۆوە لێدەدات ئەی خۆشەویستی دڵم.

هەروەك ئیبنو تەیمییە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)دەڵێت: "دڵ تەنیا بۆ خۆشەویستی پەروەردگار خولقێنراوە."

دڵم بۆ تۆیە، هۆشم بۆ تۆیە، ئەی جوانترینی ناو گەردوون.

ئیلاهی، تۆ خودامی، خودای هەموو ئەوانەشی کە دەڵێن خودای دیکەمان هەیە جگە لە تۆ.

من زۆر دڵنیام لەوەی تۆ توانای لێخۆشبوونی تاوانەکانت هەیە، دەسا لە تاوانەکانم خۆش بە یا الله.



هاوەڵی چاک و باش، بۆشـــایی دڵت بە زیکری پەروەردگار پڕ دەکاتەوە و بەرەو چاکە ڕێنوێنیت دەکات و لە خراپە بە دوورت دەگرێت.

بەڵام هاوەڵی خراپ، خۆی بۆشـــایی دڵت پڕ دەکاتەوە و بەرەو خراپە ڕێنوێنیت دەکات و لە چاکە بە دوورت دەگرێت.

حەزرەتی عومەری کوڕی خەتــاب (خودا لێی ڕازی بێــت) فەرمووی: "خودای گەورە دوای ئیسلام، هیچ نیعمەتێکی وەک هاوڕێی باش بە مرۆڤ نەبەخشـیوە، هەرکەسێک هاوڕێیەکی وای دەستکەوت کە خۆشەویستی و چاکەی زۆری لێ چنگ دەکەوت، با دەستی پێوە بگرێت.



ئەگەر ئازیزەکەت لێ ڕۆیشت،

بڵێ: "حسبی الله"

ئەگەر نزیکەکانت لێ ڕۆیشتن،

بڵێ: "حسبی الله"

ئەگەر هاوڕێیەکی گیانی بەگیانیت لێ ڕۆیشت،

بڵێ: "حسبی الله"

ئەگەر هەموو دونیا لەلات ڕۆشتن،

بڵێ: "حسبی الله"

تەنیا و تەنیا پەروەردگاری میهرەبانت بەسە و پێویستت بەکەس

نییە.

بۆیە بۆ هەموو ئەو کەس و شتانەی لەدەستیان دەدەیت بڵێ:

"(خۆ هێشتا پەروەردگارم لەدەست نەداوە)" ئەوەش تەواوی

پێویستییەکانمە و ئەوم بەسە. ئەوەش کاملی کاملە.



کاتێك مرۆڤێك تۆی خۆشدەوێت، هەست بە هێز و دڵخۆشی دەکەیت.

کاتێك مرۆڤێك تۆی خۆشدەوێت، وا تێدەگەیت تۆ جوانترین شتی ئەم دونیایەیت.

کاتێك مرۆڤێك تۆی خۆش دەوێت، دونیا وا دەبینی بۆت فراوان بووە. ئەی ئەگەر پەروەرێنی مرۆڤەکان خۆشی بوێیت! ئەوکاتە چی؟

خودای بەهێز، خودای دڵخۆشی، خودای پڕ لە جوانیی، خودای بێ نیاز، خودای باڵادەست، ئەگەر خودای گەورە تۆی خۆشویست؟ چەندە براوەیت! لە قسەی خەڵک گەڕێ، هەر خودا بەسە. هەر ئەو خۆشی بوێیت بەسە، دڵارام بە.



هەندێك مرۆڤ هەن ڕاستیی خۆشەویستیی خۆمانیان بە کردەوە و گوفتار بۆ دەسەلمێنین، بەڵام ئەوان خۆشەویستیی ئێمەیان لا گرنگ نییە و پشت گوێی دەخەن، ئەوجا چ ئێمە خۆشەویستییەکەمان بۆ سەلماندبن یان نا، گرنگ ئەوەیە باوەڕیان بە خۆشەویستییەکەی ئێمە نییە.

مرۆڤەکان جۆر بەجۆرن و کەللەڕەقەکان زۆرن، بۆیە مێشکت ماندوو مەکە و ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخۆشەویستییەکەت نییە، ڕێک پشت گوێیان بخە.



ئارام بگرە، دونیا خانەی بەڵاو موسیبەتانە، (وَلَلآخِرَةُ خَيْرٌ لَكَ مِنَ الأولَى) بەهەشتیش بە ناخۆشییەکان دەورە دراوە، ئەوەی ناخۆشی نەبینێت ناچێتە بەهەشتەوە.

ئەگەر چوونە بەهەشت ئاسان بووایە، ئەو کاتەی دەچوینە نێوی نەدەحەسایینەوە.

چونکە پێشتر لە دونیادا خۆشیمان بینیبوو، لەبەر ئەوەشە خودا حەسانەوەی تەواوی لە دونیا دانەناوە، بۆ ئەوەی لە قیامەت بە تەواوی بحەسێینەوە.

نمونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە: "ئەگەر کەسێك بە "واسیتە" لە زانکۆ دەرچوو، وەك ئەو کەسە دڵخۆشە کە بە هەوڵ و ماندووبوونی خۆی دەرچووە؟

نەخێر، بێگومان ئەوەی خۆی ماندووکردووە زیاتر دڵخۆشە، چونکە بەرهەمی ماندووبوونی خۆیەتی.

کەواتە ئەوەی عیبادەتی زۆر دەکات، ئەو فەرمانانەی خودا و پێغەمبەرەکەی پێیان کردووە جێبەجێیان بکات، دەگاتە پلەی ڕەزامەندیی خودا و قەت بێهیوا نابێت



تکات لیَ دەکەم، پێش ئەوەی ڕۆح لە لاشەت جیا ببێتەوە

تێشووی چاک هەڵبگرە.

حەزرەتی (حاتەمی تائی) دەیفەرموو:

"سەیری گشت مرۆڤەکانم کرد، هەموویان خۆشەویستێکیان

هەیە. بەڵام کاتێك دەگەنە لای گۆڕ، گشتیان بەجێیان دەهێڵن.

بۆیە چاکەکانم کردە خۆشەویسترینی خۆم، تاوەکو لەنێو

گۆڕدا لەگەڵم بن."

ئەو پارە و پۆست و جوانی و تەندروستییەی هەتە،

تاقیکردنەوەیە. تا بزانێت چۆنی بەکاردەهێنێت، چاک بزانە

ئەوانە هیچیان نیشانەی ئەوە نین کە خودا تۆی بە تایبەت

خۆشدەوێت بۆیە پێیداویت، نەخێر بە هیچکام لەوانە دیار ناکەون،

ئەی دەزانی کەی پەروەرێن خۆشی دەوێیت؟

ئه‌و كاته‌ى نيعمه‌تى ديندارى و به‌رده‌وامبوون له‌سه‌ر ئه‌و ئايينه جوانه‌ى پێ خه‌ڵات كرديت و له‌سه‌رى به‌رده‌وام بوويت.



پەروەرێن لە بکوژێک خۆش بوو کە، ١٠٠ کەسی کوشتبوو!

پەروەرێن لە زیناکەرێک خۆش بوو، کە ناوی بە سەگێك دابوو!

پەروەرێن لە ئادەم خۆش بوو، کە لە فەرمانەکانیشی دەرچوو بوو!

پەروەرێن لە پیاوێکی بەنی ئیسرائیل خۆشبوو، لەکاتێک ئەو پیاوە لە گوناهباران بوو، بە جۆرێک زۆر دوور بوو لە پەروەردگارەوە کە دووریی نێوانیان ٤٠ساڵی خایاند، دوای ئەو هەموو ساڵە ئەو پیاوە داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگار کرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار، ئینجا پەروەردگاری بەخشندە لێی خۆشبوو و لە تاوانەکانی بووری!

خودای بەخشندە لە پیاوێکی تری نەوەی ئیسرایل خۆشبوو، دوای ئەوەی ئەو پیاوەی داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگار کرد بارانی بۆ باراندە خوارەوە.

هەر لێبووردن و چاوپۆشی.

ئێمەی مرۆڤ ئاواین، هەڵە دەکەین و ڕاستی دەکەینەوە.

ئه‌گه‌ر په‌روه‌رێن كه‌ دروستكه‌رمانه‌، به‌ هه‌ڵه‌ و لادانه‌كانه‌وه قه‌بووڵمان بكاته‌وه‌، لێمان ببوورێت، له‌ كاتێكدا ئێمه‌ به‌نده‌ی ئه‌وین،

ده‌ی كه‌وابێت بۆچی له‌ مرۆڤه‌كانی ده‌وروبه‌رت خۆشنابیت، له‌كاتێكدا ئێمه‌ مرۆڤین!

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بخه‌ویت، له‌ هه‌موو كه‌سه‌كان خۆش ببه‌.

تاكو به‌ ئارامی و ئاسووده‌ییه‌وه‌ بچیته‌ باوه‌شی ئارامییه‌وه‌.



نوێژ، بە دوای شتی دیکەدا مەگەڕێ کات لە خۆت مەکوژە.



به پەرستشەکانت مەنازە، کێ نالێت لە کۆتاییەکانی تەمەنت وەک ئەو پیاوەی لێ نایەت کە لەبەر ئافرەتێک بوو بە گاور، کەچی لە شەوی زاوابوونی مرد و بە ڕووڕەشی گەڕایەوە لای پەروەردگار.

ئەوەتا حەزرەتی ئازیزمان (سەلامی خودای لەسەر بێت) داوا لە پەروەرێنی دەکات کە جێگیر و چەسپاوی بکات لەسەر ئایین و دەفەرمووێت: "پەروەردگارا، ئەی هەڵگێڕەوەی دڵەکان، دڵم لەسەر ئایینەکەی خۆت ڕاگیراو و چەسپاو بکە."



ڕاسته هەندێك شت ئازارت دەدەن، بەڵام فێرت دەكەن زیاد له ڕاده باش و ساویلكه نەبیت.



ئەوین واتا مانەوەی دڵ لەسەر پەیمانەکان، جا هەرچەند مەودایەکان دوور بن.

ئەوین واتا دڵەکان پارێزگاری لە یادگارییە جوانەکان بکات، هەرچەندە مەودایەکان دوور بن.

ئەوین یانی دڵەکان لەسەر ئیخلاس بەردەوام بێت هەرچەندە شێوە و ڕووەکان لەبەردەممان بگۆڕێن.

ئەوین یانی دڵەکان بەناوی خۆشەویستەکانییانەوە هەڵکۆڵرابن، تا ئەو کاتەی دڵەکان دەوەستێت و لەگەڵ خۆشەویستەکەت زیندوو دەکرێتەوە.

ئێستا زانیت؟!



یەکێک لە جوانترین یادگارییەکانی منداڵیم کە تێیدا ژیاوم:

لە هۆدەی ماڵەکەی خۆمان دەخەوتم، کەچی کە بێدار دەبوومەوە، لەسەر سیسەمەکە بووم!

پەروەردگار وابکەیت هەرگیز دەستەکانی دایك و باوکم ئاگری دۆزەخ نەبینن.



ئەو خەمانەی ئێستا هەمانن تێدەپەڕن.



پەروەردگار دادگەری و ناوەندگیری و دانایی و دادپەروەری لە هەمووشتێکدا خۆشدەوێت.

لە کارەکانتدا دادگەربە، تا ژیانت سەرانسەر جوان بکات!



کاتێ شتێکت سەرنجی ڕاکێشایت.

بڵێ: "ماشاءالله لا قوة إلا بالله"

کاتێك ددان بەو جوانییەدا دەنێیت کە پەروەردگار دروستی کردووە و، دوعای بەرەکەتی بۆ دەکەیت خۆ هیچت لێ کەم نابێت.

حەسوود مەبە و ئازاری خۆت و دۆست و برایانت مەدە.



یەکێك لە پێشینە چاکەکان جببەیەکی جوانی بە پارەیەکی زۆر کڕی بوو، لەکاتی نوێژدا لەبەری دەکرد و، دەیفەرموو: "پەروەردگار لە هەموو کەسێک باشترە بۆ ئەوەی خۆمی بۆ جوان بکەم."

بۆیە بایەخ بە بۆنی خۆش و پاکوخاوێنی جلوبەرگی خۆت بدە.



بە هەموو ئاواتەکانت،

بە هەموو خەونەکانت،

بە هەموو ئامانجەکانت،

بە هەموو ئەوشتانەی حەزت لێیە، بڵێ:

"بەویستی خودا پێم دەگەن"



تەنانەت بە دابڕان!

تەنانەت بە دوۆڕانیش!

بڵێ: (ڕەنگە خێری تێدا بێت)، تۆ چوزانیت، لەوانەیە پەروەرێنت زۆر باشتری بۆ دانابیت، بە جۆرێک هەر خەیاڵیشت بۆی نەچوو بێت و هەرگیز پلانیشت بۆی دانەنابێت، پەروەردگار لە مرۆڤ زۆر زیاتر بە حیکمەتترە، نموونەی باڵاش هەر بۆ پەروەردگارە.

ئەوەی پەروەردگار بۆت دەکات، لەوە زۆر زۆرترە کە تۆ گومانی باشی پێ دەبەیت، ئەو بەو بەخشندەییەی پێت دەبەخشێت لەسەروو ئەوەوەیە کە پێشبینی دەکەیت.

دوودڵ مەبە، ئەو پەروەردگاری ئازیزی ئێمەیە.

ئارام بە.



ڕەنگە ئەمشەو بە بێهیوایی لە شتێکەوە خەوتبێت.

بۆ بەیانییەکەی پەروەرێن بە دڵخۆشی و چارەسەربوون بێدارت بکاتەوە، هەروەک چۆن لە شەوی ئیسرا و میعراجدا لەگەڵ پێغەمبەرەکەی ئەنجامیدا.



پرسیار لە یەکێک لە پیاوچاکان کرا:

"کەسێک دەناسیت نزاکەی گیرا بێت؟"

فەرمووی: "نەخێر، بەڵام ئەو زاتە دەناسم کە نزاکان قبوڵدەکات."

بۆیە دڵت پەیوەستی ئافرێنەر بکە نەک ئافرێندراو.



چ سەیرە!

ئەو کەسانەی ڕۆژێك لە ڕۆژان خۆشمانویستون، چۆن دڵیان دێت دڵمان بشکێنن!

ئیبن قەییم دەڵێت:

"دوورترین دڵ لە خودا، دڵێکی ڕەقە"



ئەگەر بەو جۆرەی کە دەیڵێیت، خۆشتدەوێت، برۆ بەر دەرگایان و لەسەر جوامێری تەواو بە حەڵاڵی داوای دەستی لە دایك و باوکی بکە.



سوڵتانی دڵان (سەلامی خودای لەسەر بێت) دەفەرمووێت:

"کاتێک بەیانی بەسەر نەوەی ئادەم دا دێت، هەموو ئەندامەکان لە دەست زوبان هاواریانە و دەڵێن: "لە خودا بترسە، ئێمە پەیوەستی تۆین، ئەگەر تۆ ڕاگیراو بیت، ئێمەش ڕاگیراو دەبین. ئەگەر تۆ هەڵە بکەیت، ئێمەش تووشی زەرەر دەبین."

خۆت بۆ ئەو شتە ئامادە بکە.

پەروەردگار لە هەموو وشەیەکت دەپێچێتەوە، کە گوتووتە.

لە هەموو واژەیەکت دەپرسێتەوە، کە نووسیوتە.

خۆت ڕزگار بکە، وەگەر نا بەفەتارەت دەچیت.



ناکرێت تۆ خۆت ڕۆشن نەبیت، کەچی بۆ من ببیتە چرا.

ئەوانەی قسەی نایاب و باقوبریق دەکەن، سەیر بکە بزانە لە خۆیاندا ڕەنگ دەداتەوە؟ ئەگەر وانەبوو، بزانە تەنیا تووتییەکە و هیچی تر.



بێزاری  له خۆت.بەدوور بگره، سەرت ڕاحەته!

زەحمەتی له خۆت بە دوور بگره، سەرت ڕاحەته!

سەختی و ناخۆشییەکان له خۆت دوور بگره، سەرت ڕاحەته!

وەڵامی ئازارەکان مەدەرەوە، جا چ ئەو ئازارە له خەڵکییەوە بن، یاخود له شەیتان.

مەهێڵە ئازارەکان ئاوێزانت بن، بەڵکو بە پشتبەستن بە خودا لەناوی ببە.

لەبەر ئەوەی تۆ بەندەی ئەویت، بەستە پەروەردگار پەناگیرت بێت.



نەرموونیان بە...

(نەرموونیانی لە ڕەوشتجوانیی و ئاکارە بەرزەکانە)

پەروەردگار بەرانبەر ئێمە نەرموونیانە و کەسە نەرموونیانەکانیشی خۆشدەوێت، بۆیە توڕەییەکانت مەهێڵە. تەنیا بە چاکە و لێخۆشبوون و پەڕەی نوێ وەڵامی خراپەکاران بدەوە.

لە یادت نەچێت پاداشت لە جۆری کردارە.

بەخشندەبە تا بەخشەر بتبەخشێت.



ڕێوی فێڵباز نەتخەڵەتێنێت!

بەوەی کە پێت بڵێ:

"ها ئەوە ژمارەکەم، من دەمەوێ هاوسەرگیریت لەگەڵ بکەم."

باوەڕم پێ بکە!

ئەگەر ڕاستگۆ بێت، دێتە بەر دەرگایماڵتان و دێتە پێش.

وریابە باسکردنە چەواشەکارەکانی هەڵتنەخەڵەتێنێت و پاکیت

لەدەست بدەیت!

" دەست بە پەتی پاکییەوە بگرە، سەیری دایە عائیشەت بکە

ڕەزای خوای لێ بێت" و لە دواوەی بڕۆ لەپێناو گورگێکی

فێڵباز، پشتی تێ مەکە و دەستی بەرمەدە.

توخوا توخوا ئافرەتە موسوڵمانەکان پابەند و جێگیربن، دەست

بگرن بە ئایینە پاکەکەی پەروەردگارەوە.



خۆبەکەمزان بە.

تۆ بەو ڕۆشتنە خۆبەگەورەزانییەت ڕێگاکان کورت ناکەیتەوە.

بەو خۆ بە سەرسامبوونەت خۆ چیاکان ناڕوخێنیت.

چاک بزانە نینۆکەکەت ناگاتە بستێک لەئاستی بەرزیی بچووکترین چیا.

ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) پیاوێکی بینی زۆر بەخۆبەزلزانییەوە بەڕێگادا ڕێی دەکرد، گوتی: "بێگومان شەیتانەکانیش برایان هەیە"



هێندە خەم لە خەڵکی مەخۆ، تۆ ژیانێکی تایبەت بە خۆت هەیە، نەفسی تۆ مافی هەیە بەسەرتەوە.

ژیانێکی خۆش بژی. چێژ لە کاتەکانت ببینە. ئەو کار و کردەوە چاکانە بکە کە سوودیان بۆ خۆت هەیە و پەروەردگاریش لێت ڕازی دەبێت. ئەمە بکە بە ئامانجی خۆت، هەر ئەم شتە ئامانجی سەرەکی تۆیە لە ژیانی دونیادا.

Amal Omed



شاردنەوەی ئێش و ئازار کاری حەزرەتی خۆشەویست (سەلامی خودای لەسەر بێت) بووە.

ئەگەر خەمبار بوویت، دوای ئەوەی ئێش و ناخۆشیت بینی، ڕازی بە. دوایی ئازارەکانیش لێبووردە بە.

چونکە پەروەردگار خۆی پلە و پایەت بەرز دەکاتەوە.



پەروەردگاری مەزن بەر لە دروستکردنی زەوی و ئاسمان بە پەنجا هەزار ساڵ، پێنووسی دروست کرد.

بە پێنووسی فەرموو "بنووسە"

پێنووسیش هەموو ئەو شتانەی نووسی، کە تۆ دەیانکەیت.

هەروەها هەمووشتێکی نووسی کە لە رزق و پاراستن بۆت دێن.

دڵنیابە.

خودا لە پێش بوونی تۆوە، لە تۆ زاناترە.

هەر ئەویش هەموو کارێکی بۆ پێش هاتنە دونیات ڕێکخستوویت،

ئەی بەندە، ئا ئەوە خودایە. کە وابێت دڵئارام بە.

بە ویستی خودا هەموو شتێك بەباشی دەڕوات.



لە سوودەکانی "تێڕامان و بیرکردنەوە" : دانایی بە مرۆڤ دەبەخشێت، ئیمانی زیاد دەکات، دڵگوشادی لە لایەن پەروەردگارەوە پێ دەبەخشێت.

ئەم پەرستشە بە پەرستشی بێدەنگ ناوزەند دەکرێت، پاداشتی بەندەی تێدایە، دەرگای زانست و مەعریفەتی بەڕوودا واڵا دەکات.



هاوڕێیەتی ئەوانە مەکە کە لەدەستدەرچوون.

لەگەڵ یەکێک دانیشتم، هەموو قسەکانی باسی جلوبەرگ و زێڕ و سەفەرکردن و ئەو شتانەی دەیکڕێت بوو، وا تێدەگەیت هەموو ئەو شتانە دەمێننەوە و نافەوتێن!

لە ئێستاوە بیربکەوە هاوڕێیەتی کێ دەکەیت.

لە ئێستاوە بزانە هاوڕێکانت تۆن و ئاوێنەی تۆن.

باوەڕی تەواوت هەبێت کە هەندێك شت لە هاوڕێیانت فێر دەبیت، بۆیە هاوڕێیەتی ئەوانە بکە کە قورئانیان ئەزبەرە.

هاوڕێیەتی خوێنەران بکە، چونکە تۆش دەبیتە خوێنەر.

لەگەڵ ئەوانە هاوڕێیەتی دروست بکە کە شوێنکەوتەی سوننەتی حەزرەتی پەیامبەرن (سەلامی خودای لەسەر بێت)، چونکە تۆش وەک ئەوان شوێنکەوتەی سوننەت دەبیت.

هاوڕێیەیی زانایان بکە، تۆش دەبیتە زانا.

هاوڕێیەتی داهێنەران بکە، وەک ئەوانت لێ دێت.

لەگەڵ گەشبینیان دۆستایەتی بکە، وەک ئەوان دڵخۆش دەبیت.



ئارامبگرە لەسەر ئەو تۆمەت و قسە ناڕاستانەی ناڕاستەت دەکرێن، ڕۆژگارێک دێت ڕاستی ئاشکرا ببێت و ڕوون ببێتەوە.



تۆ شایەنی ئەوەی خۆتت خۆشبوێت.



زانایی تابعی "سەعیدی کوڕی موسەییەب" دەفەرموویت:
"ئەوەی چاکەکار بێت بەرانبەر دایك و باوکی، ئەوا هەرگیز مردنێکی خراپ نامرێت"

خودایە بمانگێڕی لەو کەسە چاکەکارانەی لەگەڵ دایك و باوکیان باشن.



حەسوودی لە لای نزیکەکانەوە زۆر مەترسیدارە.

لای ئەو کەسانەی پەیوەندییەکی بەهێز کۆتان دەکاتەوە، زۆر مەترسیدارترە لە خەڵکانی تر.

بۆیە کارەکانت بە شاراوەیی ئەنجام بدە.



خۆشی ژیان لەوەدایە کە دایك و باوکت لێت ڕازی بن، لەبیر نەکەیت دوای ئیمان بە خودا، پرسیاری مامەڵەکردن لەگەڵ دایك و باوکت لێ دەکرێت!



ئاگادار بە خەڵکی تۆمەتبار مەکە.

مەکحول دەڵێت:

"بینیم کەسێک نوێژی دەکرد،

هەر جارێک رکوع و سوجدەی دەبرد، دەگریا!

له دڵی خۆم گوتم ئەوە بۆ ڕیایە

پەروەردگار گریانی ساڵێکی لێ قەدەغەکردم."



لۆمەم مەکە گەر بڕوام پێ نەکردیت!

چونکە پێشتر درۆت لەگەڵ کردم.

ڕۆحەکان وەهان یەکەم جار سیفەتێکت لێ ببینن، بۆ هەمیشەیی لە ناخیان دەمێنێتەوە.



تۆ دەبینێت، کاتێک دەچرپێنی: "ئیلاهی من!"

تۆ دەبینێت، کاتێک بە چاوێکی پڕ خەم و حەسرەتەوە سەیری ئاسمان دەکەیت.

ئارام بە، پاشای پاشاکان تۆ دەبینێت و لێتەوە زۆر نزیکە، بۆیە لە پاڕانەوەکانت مەوەستە و هەر بڵێ: "مەعبودی تاقانەی من!"



ئەوەی لە تای تەرازوودا سەنگین و قورسە:

(سبحان الله و بحمده ... سبحان الله العظيم)

پەروەردگاری هەردوو جیهانیان تەرازوومان سەنگین بکەیت.



ئەگەر ئارەزوو و شەهوەتەکان بەرەو ڕووت هاتن،

تۆش وەک حەزرەتی "یوسف" ڕا بکە بۆ دەرگا و هەڵێ.



خەم لە کراسە دڕاوەکەت مەخۆ، کە لەکاتی ڕاکردن لە گوناهـ دڕاوە، چونکە هەر کات تۆ لە پەروەردگار ترسایت، ئەویش بەرگی پارێزراویت لەبەر دەکات و لە گشت کراسەکانی دونیات دەپارێزێت.



ئەو تەنیاییەی تۆ بەشوومی دەزانیت، زۆرجار خەڵاتە.

بیر بکەوە، کێ ناڵێت خودا تۆی تەنیا کردووە، تا تەنیا لەگەڵ ئەودا بیت.

ئەی نابینی حەزرەتی ئازیزی دڵان (سەلامی خودای لەسەر بێت)ی, بەتاقی تەنیا دەبردە کێوی سەور بۆ موناجات!



خۆشت بوێت،

بیدوێنە،

سەردانی بکە،

خەمی هەڵبگرە،

بەڵام هەرگیز نەڵێیت "خۆشم دەوێیت"، خەڵکی ئەمڕۆ کاتێك زانی خۆشت دەوێت، ئەوکاتە پشتگوێت دەخا!

.



هەرکات دەڵێیت:

"حسبي الله ونعم الوكيل"

بزانە لە سەرووی ئاسمانەکانەوە پەروەرێنی ئازیز ئاگادارە و پەیمانی داوە سەرت بخات، هەروەک ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر بێت)ی, بەسەر قەومەکەیدا کە لەنێو ئاگردا دەیانسووتاند سەر خست.



دڵخۆش بە.

دڵخۆش بە کاتێک نان دەخۆیت، چونکە کەسانێک هەن نان نییە بیخۆن.

دڵخۆش بە کاتێک لەگەڵ خێزانەکەت دەمەتەقێ دەکەیت، کەسانێک هەن سایەی دایك و باوکیاب و خێزانیان لەسەر نییە.

دڵخۆش بە کاتێک بەیانیان لە خەو هەڵدەستیت، لەملاوە کەسانێک هەن لەبەر ئازار نەخەوتوون.

دڵخۆش بە کاتێک سوژدە بۆ پەروەردگاری خاوەن میهر دەبەیت، ئێستاش خەڵکانێک هەن سوژدە بۆ مشک و مار دەبەن.

دڵخۆش بە... دڵخۆش بە سەدان دڵخۆشی دیکە هەن، تۆش دەتوانییت بیانژمێریت:

..........................................

لە ناخی دڵەوە بە خالقی خاوەن ئەوین بێژە:

"الحمد الله علي كل حال"



سوپاس خوای گەورە



ڕێگاکانی ئاسوودەیی گەلێك زۆرن، بەو مەرجەی ژیرمەندانە واز لە کۆمەڵێك شت بهێنیت:

قسەکردن،

گرنگیپێدان،

وازهێنان لە خەڵک.



قسەی خەڵک ،
نەفسیەی صورتا:

وازیان لێ بهێنه

با بیرت بکەن.

ئەوانی فەرامۆشیان کردوویت با تێبگەن،

تۆ هەمیشە لە لایان نامێنیت.



پەیامی پەروەرێن چەندە ئاسان و جوانە:

**(لن یموت قلب تعلق بالله)**

واتە: ئەو دڵەی بە خودا پەیوەستە، هەرگیز نامرێت.



گوتراوه:

"ئەگەر تۆ پشتی براکەت نەگریت و

کاتێک کەوت، هەڵی نەستێنیتەوە.

کاتێک ماندوو بوو، شتە باشەکانی بیر نەهێنیتەوە.

کاتێک خەمبار بوو، خەمەکانی لە ئامێز نەگریت.

کاتێک تووشی ناخۆشی بوو، نەبیتە پشت و پەنای.

ئەی بە چ مانایەک تۆ هاوەڵ و دۆستی ئەویت؟!



پەروەرێن خۆی پارێزگاری لە ئەولیاکان دەکات.

بۆیە هەموو دەم ئەوە لەسەر زارت بێت: "ئیلاهی لەوانەم حساب بکەیت، بۆ تۆ سوڵحاون."

ئەگەر بۆ خودا سوڵحایت، ئەویش پارێزگاریت لێ دەکات.



دەڵێن:

"ئەگەر تۆ پشتی براکەت نەگریت و

کاتێک کەوت، هەڵی نەستێنیتەوە.

کاتێک ماندوو بوو، شتە باشەکانی بیر نەهێنیتەوە.

کاتێک خەمبار بوو، خەمەکانی لە ئامێز نەگریت.

کاتێک تووشی ناخۆشی بوو، نەبیتە پشت و پەنای.

ئەی بە چ مانایەک تۆ هاوەڵ و دۆستی ئەویت؟!



دژایەتی نەفس جەنگێکی یەکلاکەرەوەیە لە ژیانی دونیادا.

ئەو جەنگەی تا بەخۆت کۆتاییت پێ نەیات، هەرگیز کۆتایی پێ نایەت، تا ڕۆحت تەسلیمی پەروەردگارت نەکەیت، ئەو جەنگ و دژایەتییە بەردەوامە لەگەڵ نەفسی خۆت!

یان ئەوەتە بەسەرکەوتووی تێیدا دەردەچیت، دەستکەوتەکانیشت چاک دەبێت.

یان بە دۆڕان تێیدا دەردەچیت و، چەندان تاوانت لەسەر دەبێت.



دەبێت لە ناخی خۆتدا پایزێک دابنێیت، هەرکات بینیت گرنگیت پێنادەن، هەڵیانوەرێنیت و بیانخەیە بەر گسکی ژیان.

وابکە، با بە گەمژەت نەزانن.



تۆ دەبینێت، کاتێک دەچرپێنی: ئیلاهی من!

تۆ دەبینێت، کاتێک بە چاوێکی پڕ خەم و حەسرەتەوە سەیری ئاسمان دەکەیت.

ئارام بە، پاشای پاشاکان تۆ دەبینێت و لێتەوە زۆر نزیکە، بۆیە لە پاڕاوەکانت مەوەستە و هەر بڵێ: "مەعبودی تاقانەی من!"



وا تێمەگەن هەموو ئازادییەکانی ئەم ژیانە خۆڕایین، تا بە دڵی خۆت چیت بوێت بیکەیت!

ڕۆژێک دێک لێپرسینەوە لەگەڵ گشت ساتەکانی ژیانت دەکرێت، تکایە خۆت ئامادە بکە.



گوتراوە:

"ئەوەی بیەوێت لە ژیانت بچێتە دەرەوە، تەنانەت لە کوونی دەرگاش بێت هەر دەڕوات."

ئەوەشی بییەوێت بێتە ناو ژیانتەوە، تەنانەت لەنێو دیوارەکانیدا دەرگایەک درووست دەکات و دێتە ژیانتەوە.



خۆ فەرز نییە هەموو شت بزانیت، ئەگەر نەتزانی بە شانازییەوە بڵێ: "نازانم."



ڕێز و شەرم تەنیا لە جل و بەرگدا نییە!

بەڵکو هەیە لە دەنگیدا هەیە،

لە پێکەنینیدا هەیە،

لە شێوازەکانیدا هەیە،

لە ڕەفتارەکانیدا هەیە،

هەیە لەخودی شەرم و ڕەوشتیدا هەیە،

کەواتە دەست بە شەرم و ڕێزەوە بگرن و لەسەری توندوتۆڵ بن.



مرۆڤ

دەبێت بە کرداری تاقی بکرێنەوە

نەک بە قسەکانی.

ئای چەند زۆرن ئەوانەی

کردەوەکانیان ناشرین و قسەکانیان نوقلئاسان!



کەسی خائین هەر شکست دەهێنێت، جا هەر چۆنێک بێت.

چونکە هیچ ڕێنیشاندەرێکی ئەم گەردوونە نییە, جگە لە پەروەردگار، ئەمیش دەمێکە خۆی لە پیلانی خائینان بێبەری کردووە.



سەگەکان زۆرجار لە هەندێک خەڵک باشترن!

هیچ کات بیرم نایات کاتێك خواردنم بەخشیبێتە سەگێکی هار، پاشان، ئەگەر لە برسانیش مردبا پەلاماری دابم!

بەڵام بەداخەوە.

زۆربەی ئەوانەی ئازاریان داوم مرۆڤن!

لەکاتێکدا زۆرجار بەرژەوەندیی ئەوانم پێش خۆم دەخست.

دڵدانەوەی ئێمە ئەوەیە، کە براکانی یوسفیش زوڵمیان لە یوسف کرد.



لەو ژیانەدا کەوتووینەتە نێوان دووڕیانی دژ بەیەک، یان ئەوەیە براوە دەبیت، یان دۆڕاو.

هەڵبژێرە کامەیانت دەوێت؟

براوە



خەڵکی لەو کاتەی جیادەبنەوە، یان دەدۆڕێن، ئینجا باوەڕ بە قەزا و قەدەر دەکەن.

بەڵام کاتێک سەرکەوتوو دەبن، سەرفراز دەبن، شتی مەحاڵ ئەنجام دەدەن، زۆرێک لەوانە وا باوەڕ دەکەن خۆیان کارە مەحاڵەکەی ئەنجام داوە، وابیر دەکەنەوە ئەو تاکە کەسە هیچ شتێکی مەحاڵ لەگەڵ ئەودا بوونی نییە!

چۆن ئەوانە دەتوانن ئاوا بیرکەنەوە؟!

چۆن ئەوانە سەرەتا بیر لە سوپاسگوزاری پەروەرێن ناکەنەوە؟!

ئەگەر کارێکی ئەستەمت ئەنجامدا، بە خەڵکەکە بڵێ هیچ شتێک لەگەڵ خودا مەحاڵ نییە، نەک هیچ شتێک لەگەڵ مندا مەحاڵ نییە!



ئەم دۆخە خراپەی لە جیهاندا لە ئارادایە، دەتوانین بیگۆڕین، بەو مەرجەی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە خودی خۆمانەوە دەست پێ بکەین.

هەموو گۆڕانکارییەک سەرەتا لە ناخدا دەست پێدەکات.



ڕەنگە حیکمەتی پەروەرێن وەها بێت، ئەو شتانەی داوای دەکەیت، پێت نەبەخشێت. ئەوەش ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگارە بەرانبەر بەندەکەی، لەبەر ئەوەی پێنەبەخشینی هەندێک شت لە ڕاستیدا خودی بەخشینە.

لە بەخشندەیی پەروەردگار ئەوەیە، ڕێ نادات تووشی نارەحەتی بیت و، بە شتی زۆر باشتر قەرەبووت دەکاتەوە.



ژیرمەندترین ئەو کەسانەی بینیومن، یەک سیفەتی هاوبەشیان هەبووە ئەویش: هەرگیز خۆیان بە کەسانی دیکە بەراورد نەکردووە، تەنیا خۆیان بوون.



ئەگەر بە دوای کەسێکدا دەگەڕێیت کە دڵخۆشی هەمیشەییت پێ ببەخشێت و لە کاتە سەختەکان خولەکێک لێت دانەبڕێت و ژیانت بگۆڕێت، ئەوا سەیرێکی ئاوێنە بکە و ئەوکات ئەو کەسە دەبینیت.



دڵ لە دڵ مەدە ڕۆژەکان تێدەپەڕن و ساتەکان چرکە بە چرکە دەڕۆن، بەڵام بیرمان ناچێت

کێ دەستی گرتین و کێش دەستی بە قەدەر فرۆشتین و دەستی واڵا کردین!



پەروەرێن، تاکە زاتە بتوانیت، بە دەمی داخراویش بانگی بکەیت. لە هەر هەموو ڕۆژەکانی تۆ ئاگادارە، ئەو هەموو خەمانەی هەن لە هەرکاتێک بێت وەک دۆستێکی ئازیز گوێت بۆ دەگرێت و لەگەڵیشت چارەسەر دەکات، تەنیا ئەوەی دەوێت تۆ "نزا"یەک بکەیت.

دە ئیدی ئەو خەمبارییەت با بەس بێت!



تەنها یەک جار فرسەتی ژیانمان پێدراوە،

تکا دەکەم با ئەو پەیوەندیانەی بە یەکەوە تۆماری دەکەین با زۆر جوان بن.



هەموو کەس حەز بە بینینت ناکەن،

هەموو تۆیان قبووڵ نییە،

هەموو کەس تۆیان خۆشناوێت،

هەوویان چاکەی تۆیان لە بەرچاو نییە،

هەموویان حەز ناکەن سەربکەویت،

بۆیە کاتێك دەبیستیت قسەت پێ دەڵێن، خەم مەخۆ!

دڵی هەموو خەڵک بە تۆ ڕازی ناکرێت!



بەڕاستی پێبکەنە، پەرۆشیان بە و خۆشتبوێن.

هیچ کات ڕۆڵی کەسێکی تر مەبینە، کاتێک کە دەگریت با بۆ ئەوە بێت کە بەڕاستی ئازارت هەیە، کە پێدەکەنیت پڕ بە دڵت کەیفخۆش بە، با هەمووان بزانن تۆ ڕاستەقینەیت و ساختە نیت!



با پەیوەندییەکەت لەگەڵی تێکبچێت، بەڵام مەردانە مامەڵە بکە و لە پاشەملە هەرگیز باسی مەکە.



هەندێک لە ئازیزانمان ون کرد،

هەندێکیش ئێمەیان لێ ون بوو!

هەندێکیشیان لەگەڵ تێپەڕبوونی کات

گۆڕان و بوونە جۆرێکی دیکە، لەولاوە هەندێکیشیان وەک خۆیان مانەوە.

ئاساییە هەرجۆرێک بن، ئیدی ژیانە، نزا دەکەم هەموویان باش بن.



ئەو ڕۆژگارەی ئێمە زۆر ناخۆشیمان دەهێنێتە پێش، خەریکە نەهێڵێت زەردەخەنە جوانەکانی دۆستانیش ببینم، بۆیە دەگەمە هەر کەس نوقڵی زەردەخەنەی دەخەمە باخەڵ.



بۆ ئافرەتە سەنگینەکان.

چاک بزانن پیاوەکان هەموویان خراپ نین، تەنیا سەیری ئەو هەموو ماندووبوونەی بکە بۆ دابینکردنی ژیانێکی شکۆمەندانە چەندە ئازار دەکێشێت، بەڵام لە بەرانبەردا تەنیا ئەوەی لێت دەوێ زەردەخەنە بکەیت و تۆزێک گرنگی پێ بدەیت، خۆ لێت کەم نابێتەوە ئەگەر بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنەوەی بکەیت، دڵنیات دەکەم ئەوە هەموو ماندووبوونەکەی لەبیر دەباتەوە.



ئازیزەکان ئەوانەن کە حەز دەکەن قسەت لەگەڵ بکەن،

ئەگەرچی هیچ بابەتێکیش نەبێت تا قسەی لەسەر بکەن.

لە دەستیان مەدەن، ئەگەر بڕۆن هەرگیز ناتوانی دەستیان بخەیتەوە.



ئیرەیی و حەسوودی وەک پشکۆی ئاگرێک لەسەر دەستت بێت وەهان، جگە لە سووتانی خۆت هیچیتری لێ بەرهەم نایەت.



ئەگەر دوای وەفاتت تەنیا چاوێکت لەم ژیانە بێت و ببینیت

چەن زوو لەبیرت دەکەن و تۆیان لەبیر دەچێتەوە،

ئەوا جگە لە پەروەرێنی تاقانە هەوڵی ڕازیکردنی کەس نادەیت.



زۆر بیرکردنەوە و تێڕامان لە ڕووداوەکان مرۆڤ وێران دەکات،

وەها باشە بوار بدەیتە ڕۆژگار ڕووداوەکان خۆیان ڕوو بدەن.



ئەو ژیانەی ئێستات وەک کتێبێکی خاڵی وەهایە، کە خۆت نووسەرەکەیت و بە کارەکانت دەینووسیت،

هەوڵبدە ڕووی ئەوەت هەبێت لە ڕۆژی پەسڵان لە خزمەت پەروەرێنی جیهانیان کتێبەکەت بخوێنیتەوە.

وریا بە!



مەهێڵە تاڵی ڕۆژگار، خەمت پێ لە باوەش بگرێت.

سەختییەکان زۆربوون و ژیان وەک ژوورێکی قانگدراو بە پەژارەی لێهاتووە.

لەبیرت بێت ژیانی دونیا هێندە کورتە، خۆشی و خۆزگەکانی هەرچەند زۆریش بن ناگەن بە چرکەساتێکی بەهەشت.

لێرەش ماندووبیت، خۆشیی ئەوڵا لەبیرت دەباتەوە.



بە هەموو کەسێک مەڵێ: "تۆ وەک ژیانم وایت."

کەسێک ژیانت بێت، دەزانێت کەی بێتاقەتیت،

دەزانێت کەی دڵخۆشیت، دەزانێت کەی توانای قسەکردنت نییە، دەزانێت کەی پێویستت بە تەنیاییە، بە کورتییەکەی بێ دەربڕینی وشەکانت دەزانێت چیتە!

بۆیە بە هەموو کەسێک مەڵێ ژیانم، چونکە ژیانت ئەو کەسەیە کە هەموو کارێک دەکات تا تۆ لەوپەڕی خەمبارییەوە بخاتە پێکەنین.



جار جاره شتێک لەو کەسانە بکڕن کە دەستگێڕن.

ئەگەر پێویستیشتان نەبوو، هەر بیکڕن.

ڕەنگە کەسانێک بن نەیانەوێت سواڵ بکەن و بەو شتە هەرزانانە بیانەوێت بژێوی ماڵومنداڵیان دابین بکەن.



نائومێدی، زۆر لە پیری سەخترە

مرۆڤ لە تەمەنی پیریدا لاشەی دەچەمێتەوە,

بەڵام لە نائومێدیدا، ڕۆحی مرۆ.



فەرمایشتێکی شێخ "عەلی تەنتاوی" ڕاپچڵەکاندم کە لەیەکێک لە کتێبەکانیدا دەڵێ: "٢٧ ساڵ قازی بووم، بینیم زۆرترین حاڵەتی تەڵاق لە دوو خاڵدا ڕوویان دەدا:

یەکەم: توڕەبوونی کوێرانەی پیاوان

دووەم : وەڵامە ڕەقەکانی ئافرەتان

ئێستا با هەریەکەمان لە هەردوو ڕەگەز ئەو دوو کێشەیە چارەسەر بکەین، دەبینین چەندە لێکتێنەگەیشتنەکانمان بە زوویی چارەسەر دەبن.



دوای چەندین ساڵ ئینجا زانیم پڕچێژترین شت لە ژیانمدا ئەنجام دانی کارێک بوو کە هەموو خەڵک دەیانگوت: "ئەم کارەت پێ ناکرێت و ناتوانیت ئەنجامی بدەیت!"



پەروەرێن موژدەی دایە حەزرەتی یەعقوب (سەلامی خودای لەسەر بێت) بەوەی حەزرەتی یوسفی (سەلامی خودای لەسەر بێت)ی بۆ گەڕاندەوە.

موژدەی دایە حەزرەتی زەکەریا (سەلامی خودای لەسەر بێت) بە پێدانی منداڵێکی ناوازەی وەک حەزرەتی یەحیا (سەلامی خودای لەسەر بێت)

ئیلاهی، مەولای، پەروەرێنە نازدارەکەی من، چاوەڕێ دەکەم موژدەی باشترین شتەکانم پێ بدەی، خۆ هەر خۆت باشترین موژدەدەری.



بێگومان پیاو پێویستی بە

چوار ژن هەیە لە ژیانیدا:

١- دایکێکی میهرەبان

٢- خوشکێکی ژیرمەند

٣- ژنێکی باش و گوێڕایەڵ

٤- کچێکی قشتیلەی بەناز



هەموو کەسێک دەتوانێ پیسی و عەیبوعار لە خەڵکی بدۆزێتەوە.

خوێنەری ژیر، تۆ ببە بەو کەسەی زێڕیان تیادا دەدۆزیتەوە.



ژیان بە جۆرێک دەوران دەکات کە بەدیارییەوە واقت وڕ
دەمێنێ، بۆیە بایی ئەوە بهێڵەوە بەیانی ناچار نەبیت بڵێیت:
"چاوەڕێی ئەو خیانەت، دووڕوویی و ئیهمالکردنەم لێ
نەدەکردیت!"



با ڕاستگۆ بین لەگەڵ یەک، هیچ کەس ئەوەندە سەری قاڵ نییە  نەتوانێت هەواڵت بپرسێت و سۆراغت بکات! بەڵام ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە:

"تۆ لە کەسە گرنگەکانی ئەو نیت و پلە دوویت!"



ئیتر دەبێت ئەو ڕاستییە قەبوڵ بکەین لە ئاست کۆمەڵە شتێکدا بێدەنگی هەڵبژێرین، بۆ نموونە: کاتێک بیری کەسێک دەکەیت کە ئەسڵەن هەر نایەوێت قسەشت لەگەڵدا بکات بێدەنگ بیت.



شەکەت و ماندوو ببوو، وادەی ڕۆیشتنی بوو،

لە وتاری ماڵئاواییدا،

دەنگی پیرۆز و پڕ لە حەنینی بەرزکردەوە و

فەرمووی: "ئافرەتان ئامانەتی ئێوەن و لەگەڵیان باش بن."

ئەوە حەزرەتی ئازیزی دڵان (سەلامی خودای لەسەر بێت) بوو.

دەک ڕۆحی من بە قوربانی بێت.



٣ شت هەیە لە ژیانتدا هەرگیز وازیان لێ مەهێنە:

١- واز لە "سوپاسگوزاری" مەهێنە.

چونکە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەخششەکانتان.

"ولئن شكرتم لأزيدنكم"

٢- واز لە زیکری خودا مەهێنە.

چونکە پەروەرێن بەو هەموو مەزنییەوە یادت دەکات.

"فاذكروني أذكركم"

٣- واز لە دوعا کردن مەهێنە.

چونکە پەروەرێنی میهرەبان وەڵامت دەداتەوە.

"أدعوني أستجب لكم"



ئەگەر ئەو شتانەی لە دوامانەوە دەگوترێن،

ئەگەر بۆنی ڕاستیشی تێدا بووایە،

ئەوا ڕووبەڕوو پێمان دەگوتران.

بۆیە بەخێرهاتنی ئەو چاکانە بکە

کە هیچ ماندوونەبووین لە پێناویاندا -غەیبەتکراین-.



داده سەنگین و نازدارەکەی خۆم!

کوڕانی "باش" لەبەر "جوانی و سەرنجڕاکێشی "یەکەت تۆیان ناوێت،

هەروەها کوڕانی "خراپ"یش زۆر لەوە کەمتر و بێسەنگترن تا "جوانی و لاشە"ی خۆتیان بۆ دەربخەیت!

تۆ لەوە سەنگینتر و پاکتریت تا خۆت بخەیتە بەر تیری تەماشاکاران.



هەموو "هەست بریندارکردن"ێک فێرمان دەکات

بۆ دۆستایەتی و نزیکیی کەسێکی هەڵەمان هەڵبژاردوە، لە هەمان کاتدا پەیوەستبوین بە کەسێکی هەڵەوە.



"هاوڕێ" ئای هاوڕێ!

چەندە دڵبەر و ئەویندارى ئەو دڵەی منیت.

تۆ ئەو پارچە شیرینییەی کە تامێکی "خۆش" بە "تاڵی" ژیانم دەدەیت.

هاوڕێ گیان خۆشم دەوێیت.

دەزانی کام هاوڕێم مەبەستە؟

ئەوەی تازە بە خەیاڵتداهات، خۆیەتی ئەوم مەبەستە.



له بەرانبەر هەموو پێشهاتەکاندا، ئەگەر ئەو ڕووداوانە بەوپەڕی ناخۆشییەوەش بێن، خۆت پۆڵایانە ڕابگرە.

مادام هاتووە، بەخێربێت.



زۆر ئاگات لەو پەیوەندییانە بێت کە لەگەڵ هەر کەسێکدا دروستیان دەکەیت، چونکە داهاتووی تۆ پەیوەستە بەو پەیوەندییانەوە، بۆیە زۆر بە هۆشیارییەوە بزانە چۆن دروستی دەکەیت.

زۆرجار دەڵێن پێش پەیوەندییەکان، داهاتووەکانیان بخوێنەرەوە.



لە گەورەترین ئەو هەڵانەی ئێمە ئەنجامیان دەدەین ئەوەیە کە پەیوەندی خۆمان و ئەندامانی خێزانەکەمان زۆر سادە و ئاساییە و بگرە زۆرجار خەڵکانی دیکە زیاتر لە خوشک و دایکمان سەبارەت بە ئێمە شتەکان دەزانن! ناڵێم هەموو شتیان بۆ باس بکە، بەڵام لەبیرت بێت هەموو کات ئەوەی بە حەقیقی بۆت دەسووتێت، خێزانەکەتە!

هەرگیز ئەوە ڕوونادات، کەسێک وەک خێزانەکەت دڵسۆزتر بێت بۆ خودی خۆت.



ئامان! نەکەی ئەو هەڵە گەورەیە بکەیت، کلیلی ژیان و ڕابردووی خۆت بدەیتە دەست ئەو هاوڕێیەی تازە ناسیوتە!



زۆر زۆر ئاگاداری ناو و ناوبانگی خۆت بە، چونکە ناو و ناوبانگی تۆ وەك شووشەیەکی ناسک وایە، ئەگەر بشکێت ئەستەمە چاك بێتەوە.

ئەو گەوهەرە گرنگەی پێت بەخشراوە کە "ڕێز و شکۆ"یە، بۆ هیچ کەسێک و هیچ بارودۆخێک لە دەستی مەدە.



مەرج نییە ئەو کەسانەی قسەکانیان وەک هەنگوین شیرینە، بەرانبەر تۆ دڵسۆز و بەئەمەک بن!

مرۆڤی ئەو سەردەمە وەهایە کە هەزار ڕووە، دەگونجێت لە هەر ئانێک بێت ڕووی ڕاستەقینەی دەربخات، بۆیە پەلە مەکە.



لەو کردەوانە بەدوور بە کە دەبێتە هۆی لەکەدارکردنی بنەماڵەکەت، تۆ نازانیت دایك و باوکت چەندە بەو لەکەدارکردنە ئازار دەکێشن، ئەگەر هەستی پێ بکەیت، ئەوا دەبوویتە قەترەیەک ئاو!



با هەموو کات متمانەت بە خۆت زۆربێت، بەڵام وەها خۆت نیشان مەدە کە توانای هەموو شتێکت هەیە.

ئەوەی بە ئەسپێک دەکرێت، بە کەرێک ناکرێت، با شێوە و شکڵیشی لەو بچێت!



ڕاستە تۆ بەهێزی، بەڵام مانای ئەوە نییە دەتوانی وەک باڵندە بفڕیت!

لەو ڕۆژانە گوێم لە قسەیەکی "ڕاهێنەرێکی گەشەپێدان" بوو دەیگوت: "تۆ بەهێزی و ئەگەر بتەوێت دەتوانی هەموو شتێک بکەیت. ئەگەر مەیلت لێ بێ دەتوانی خۆت فێری فڕینیش بکەیت!"

سەیرم لێ دێت ئەو خەیاڵپڵاوییە لە پای چی؟ بۆچی ئەو خەونە زۆرە لە مێشکی دەچەقێنیت لەکاتێکدا لە توانای ئەو بەدەرە.

گەنجی ژیر، دەکرێت تۆ لە هێزێکی دیاریکراودا بتوانی قورساییەک بەرز بکەیتەوە، بەڵام ناتوانی هەمووشتێک بەرز بکەیتەوە!



بۆ هەمووشتێک پەنا بۆ گریان مەبە، با ئەسرینەکانت ئەو کاتانە بێنە خوار کە ئیدی هەموو هەوڵێکت داوە.



هەموومان بە قۆناغی ١٤ ساڵیی تاکو ٢٠ ساڵیدا تێپەڕ دەبین، بۆیە ئاگادار بە ئەو تەمەنە پڕ پڕە لە هەڵە و کەموکوڕی، بۆیە تۆ وریا بە لەوەی لە داهاتوودا پەشیمان نەبیتەوە لەو کارانەی لەو تەمەنەدا کردووتن.

پێش کردنی کارەکان، ڕاوێژ بکە و ئامۆژگاری لە خۆت گەورەتر وەربگرە.



ئەو وشانەی دەياننووسم و تۆش دەيانخوێنيتەوە،

لەوانەيە ببێتە هاندەر و پاڵنەرێكی باش لە ژيانی تۆدا،

بەڵام لەبيرت بێت تەنيا كردار گۆڕانكاری دروست دەكات.



ئەو قسەیە زۆر هەڵەیە کە دەڵێن:

"چیرۆکی خۆشەویستی دەبێت بە هاوسەرگیری کۆتایی بێت!'

بەڵکو ڕاستییەکە ئەوەیە:

"دەبێت خۆشەویستی بە هاوسەرگیری دەست پێ بکات و بە مردن کۆتایی بێت."



هەندێک جار ئەو کەسەی بەرانبەرت کە لە هەمووان بێدەنگتر

بوو،

لە هەمووان زیاتر خۆشی دەویستیت!

بەڵام تۆ خەریکی گوێگرتن بوویت لە درۆکانی کەسێکی تر و

هەرگیز بۆ ساتێک ئەوت نەبینی!



"پاشەکشە" و "هەڵهاتن" زۆر لە یەکتر جیاوازن، کاتێك لە کارێکدا دەزانیت دەکەویت و گرەنتی سەرکەوتنت کەمە، پاشەکشە بکە.

ئەوە هەڵهاتن نییە لە شەڕێکدا کە خەریکە بدۆڕێیت و هەمووان بە کوشت بدەیت، پاشەکشە بکەیت و بە پلانێکی نوێوە بێیتەوە پێشەوە.

دەڵێن: "شێر ئەگەر هەنگاوێک پاشەکشە بکات بۆ دواوە، ئەوا دوو هەنگاو دوورتر بۆ پێشەوە بازدەدات."



کامەرانی بە بێ بوونی کێشە لەژیانماندا نابێت، بەڵکو کامەرانی لە ڕێگەی سەرکەوتن بەسەر ئەو کێشانەوە بەدەست دێت کە ڕۆژگارێک تووشمان هاتوون.

ئارام بە، هەموو کێشەکان خێریان تێدایە.



جوانترین ڕەنگ:

ڕەنگی شەرمە لە ڕووخساری ئافرەتدا.



نهێنییەکانی ژیانت ئاشکرا مەکە،

هەندێکیان گوناهـ و تاوانن.

هەندێکیشیان هەڵەکردن و شەرمەزاربوونن،

تەمەن دەڕوات و لەبیرت دەچنەوە، دوای ماوەیەک

تۆبە دەکەیت و پەشیمان دەبیتەوە، پەروەرێنیش پەیمانی داوە لە تۆبەکاران خۆشبێت،

بەڵام لە یادەوەری مرۆڤەکانی تردا

ئەو شەرمەزارییانە هەر بە زیندوویی دەمێننەوە و بۆ پەردەپۆشکردنی هەڵەکانی خۆیان، ئەو نهێنییانەت بیر دەخەنەوە.

بۆیە با نهێنییەکانت شاراوە بن.



ئەگەر دەڵێیت شتێکی وەهام نییە بیدەم بە خەڵک و بیبەخشم، ئەوا دەتوانیت لە بری ئەوە: "فەرمایشتێکی باش" و "زەردەخەندەیەکی ڕاستەقینە" ببەخشیتەوە.

دڵنیا بە ئەوە چاکترین بەخششە.



کاتێك دوو خۆشەویست لەیەکتر نزیک دەبنەوە، هەرگیز حەز ناکەن لە یەکتر دوور بکەونەوە و حەز دەکەن هەر قسەیەک بێت بیدزۆنەوە و بیکەن، تا تۆزێک بەیەکەوەبوونیان درێژە بکێشێت،

ئەی ئێمە بۆ پەلەی ئەوەمانە سەر لە سوژدە بڵند بکەین!؟



## بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕەها

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | ئیسلام یان ئیلحاد | و/ ئەیاد نادر |
| ٢ | جوانتر بیربکەوە | سبحان سەید |
| ٣ | دێڕی نامەکان | تەنیا محەمەد |
| ٤ | کچی کافرۆش | هێدی سەلیم |
| ٥ | هونەری جەنگ | ن/ سون تزو<br>و/ نیاز مەستی |
| ٦ | پیانۆ | ن/ ڕۆزمێری بۆردەر<br>و/محمد جەمیل عەلی |
| ٧ | عاشقانە دێم | زامدار ڤادری |
| ٨ | چیرۆکی ڕەوشتە باڵاکان | محمد کەریم حاجی |
| ٩ | ئایا دەکرێ خوێن درووست بکرێ؟ | ئەحمەد محەممەد نەقاش |
| ١٠ | پوختەیەك لە ژیاننامەی زانا و پیاوچاکانی کورد | زانا ڤەرەداغی |
| ١١ | ستیڤ جۆبز کێ بوو؟ | ن/ پام پۆڵ جك و مەگ<br>بەلفسۆ<br>و/ ڕەوەند حەکیم |
| ١٢ | بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا | ن/ عائض القرني<br>و/ نیاز مەستی |
| ١٣ | پوختەیەك لە ژیانی عەلی کوڕی حوسێن (زین العابـدین) | عبدالرحمن محمدامین |
| ١٤ | ماهی نوورین | هێدی سەلیم |
| ١٥ | ئەبولحەسەنی ئەشعەری ( ڤوتابخانە کەلامی و فەلسەفییەکەی) | عەدنان ئەمین |
| ١٦ | ئەتەکێکی ڤسەکردن | ن: د: ئیهاب ڤکری<br>و/ دەشنێ تالیب شوانی |
| ١٧ | ١٠١ کۆدی بەڕبەرۆسا | ن/ جیهاد الترباني<br>و/ ئەحمەد حمدامین مەنتك |



کاتێك مرۆڤێك تۆی **خۆشدەوێ**،
هەست بە هێز و دڵخۆشی دەکەیت.
کاتێك مرۆڤێك تۆی **خۆشدەوێ**،
وا تێدەگەیت تۆ جوانترین شتی ئەم
دونیایەیت.
کاتێك مرۆڤێك تۆی **خۆش دەوێ**، دونیا وا
دەبینی کە بۆ تۆ فراوان بووە.
ئەی ئەگەر پەروەرێنی
مرۆڤەکان **خۆشی بوێیت**!
ئەوکاتە چی؟
خوای بەهێز، خودای دڵخۆشی، خودای پڕ لە
جوانیی، خودای بێ نیاز، خودای باڵادەست.
ئەگەر خودای گەورە تۆی **خۆش ویست**؟
چەندە براوەیت! لە قسەی خەڵک گەڕێ،
هەر خودا بەسە. هەر ئەو **خۆشی بوێیت**
بەسە، دڵارام بە.

بەرگ : ئیبراهیم ساڵح



1234567890

ناوەندی ڕەها
هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگا
0750 406 66 74
Nawandi Raha / ناوەندی ڕەها